## ناسنامەی پەرتووک:

**ناوی پەرتووک: بەزمەکانی ئەحۆل**

**کۆکردنەوە و نوسینی: مامۆستا بەرژەوەند**

**ژمارەی بەرگ: بەرگی چوارەم**

**نرخ: ٢٠٠٠ دینار**

**گۆڕینی بۆ پەرتووکی ئەلیکترۆنی: نەیڤەن**

ئەشیعە بۆ ئەحۆل ئەگرن، دکتۆرەکە لێی ئە پرسێت: ئەم هەموو کەوچکی چێشتە چی ئەکات لە مەعیدەتا؟!!!

ئەحۆل ئەڵێ: دکتۆرگیان حەفتەی پێشوو کە شروبەکەت دامێ ووتت رۆژی چوار کەوچکی چێشت بخۆ !!!

*******************************************

ئەحۆل لە ئەوروپا بوو بە سایەق تەکسی، کچێك دەستی لێ ڕاگرت زۆر ڕووت بوو.

ئەحۆل هەر لە ئاوێنەکەوە سەیری دەکرد.

کچەکە پێی ووت: چییە بۆ وا سەیردەکەی؟ یەکەم جارتە کچی ڕووت ببینی؟

ئەحۆلیش ووتی: نا، بەڵام لەوساوە سەیر دەکەم گیرفانێك نابینم چۆن پارەی کرێکەم ئەدەیتێ ؟

*******************************************

ئەحۆل بووبە تیرۆریس سەرەی هات خۆی بتەقێنێتەوە...ڕۆژێك پێش ئەوە پەشیمان ئەبێتەوە، ئەچێت وەرەقەی دکتۆر ئەکات و ئەڵێ وەڵاهی نەخۆشم، ئیشەڵا با چاك ببمەوە یەمەوە.

*******************************************

ئەحۆل و ژنەکەی دوو منااڵیان هەیە، یەك ژوری خەو و مەتبـەخێکیان هەیە.

ئەحۆل بەژنەکەی ئەڵێ: ئەمە وا نابێت خەریکە سوێم ئەبێتەوە، برۆ منااڵەکان بخەوێنە و کە چەرخێکم بۆ داگیرسانیت، وەرە مەتبەخەکە با تاکێك بکەین.

ژنە ئەچـێتە ژورەوە بـۆ لای منااڵـەکان، پـاش ماوەیـەك ئـەحۆل لـە مەتبەخەکەوە یەك لەسەریەك هەر چەرخ دائەگرسێنێ، پاش سەعاتێك منااڵە بچکۆلەکە بەوی تریان ئەڵێ: دیسان بەزمەکەیە، ئادەی خێرا دایکم خەبەربکەرەوە، تا باوکم ماڵەکەی نەسوتاندووە.

*****************************************

ئەحۆل شەوێکیان باوکی ئەمرێت.،بۆ بەیانی کەرەکەشی ئەتۆپێت، دەستی بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان، هاوار ئەکات و ئەڵێ: خوایە گیان بە قوربانی بەشتبم، بەڵام بۆ بەجووت لێمان ئەبەیتەوە ؟

*****************************************

ئەحۆل تەمەڵە ناوێرێت بچێ کارتەکەی وەربگرێتەوە، لە ترسـا بـرا بچوکەکەی ئەنێرێت و پێی ئەڵێ: کە هاتیتەوە و ئەگەر باوکم لە ماڵەوە بوو و سفرێکم تیابوو، بڵێ محمد سەلامی لێ ئەکردیت...وە ئەگەر دوو سفرم تیابوو بڵێ محمدەکان سەلامیان لێ ئەکردیت...برا بچکۆلەکەی

یەتەوە و باوکیشی لەماڵەوەیە، ڕوو ئەکاتە برا گەورەکەی و ئـەڵێ: ئومەتی محمد سەلامیان لێ ئەکردیت.

*******************************************

ئەحۆل ئەیەوێت ژن بهێنێت و ڕوی نایەت بە باوکی بڵێ.
بەدایکی ئەڵێ ئەمشەو حەزئەکەم لە تەنیشت باوکمەوە بخەوم.
دایکیشی لەتەنیشت باوکییەوە جێگای بۆ دائەخات، پاڵ ئەکەون و پاش کەمێك خۆی ئەکات بە خەوتوو.
بەدەم خەوەوە ئەڵێ: پخخخخخخخخخ پخخخخخخخ، ئاااااااخ ژنننن، ئاااااخ ژنننن، پخخخخخخ پخخخخخخ ئاخخخخ ژننن.
باوکیشی ڕوی تێئەکات و ئەڵێ:ئاااااااخ تەڕەماشششش...ئاااااخ گووت خوارد.

*******************************************

لـە ئـەحۆل ئەپرسـن: ڕات چـییە بەرامبـەر ئـەو کەسـانەی خۆیـان ئەتەقێننەوە؟
ئەحۆل دەڵێت: ئەگگگگگگ یاڕەبی خێر لە خۆیان نەبینن، ئەگگگگ یاڕەبی جەرگیان بسوتێت، وەکو جەرگی ئەو عالەمە ئەسوتێنن، ئەگگگگگ یاڕەبی هەلاهەلابن.

*******************************************

لە هەڵبژاردنی مامۆستایانا پە نجەمۆریان دانابوو.
مامۆستایەك وتبووی ئەوە چییە؟
مامۆستا ئەحۆل دەڵێت: مامۆستا گیان ئەوە بۆ ئەو مامۆستایانەیە کـە خوێنەوارییان نییە.

*****************************************

بە ئەحۆل ئەڵێن: ژنەکەت سێ کچ و سێ کوڕی بووە.
ئەحۆڵیش ئەڵێ: خۆم زانیم کەرێتییەکی گەورەم کرد کە کچی ئەو جووملە فرۆشەم هێنا.

*****************************************

سێ کچی زۆر جوان بەرێگایا ئەڕۆن و یەکێکیان ئەڵێ: حەزئەکەم کورێك بناسم کە ئەفسەر بێت.
یەکێکی تریان ئەڵێ: من حەزئەکەم پیاوێکی یابانی بناسم.
سێهەمیشیان ئەڵێ: من حەزم لە کورێکە کە یاریزان بێت.
ئەحۆڵیش لەدواوە گوێی لە قسەکانیانە، ئەچێتە بەردەمیان و ئەڵێ: من مولازم "شین چووم" و ناسراوم بە میسی.

*****************************************

ئەحۆل زۆر رقی لە ڕەنگی سورە، ڕۆژێك یەتەوە سەیرئەكات ژنەكەی دەرپێیەكی كورتی سورو ستیانێكی سوری لەبەرایە،ئەویش لەداخا خۆی ئەكات بەژێر سیستەمەكەیا و پیاوێك بەڕووتی ئەبینێت.
پێی ئەڵێ: ئەوە چییە؟ تۆش ڕقت لە ڕەنگی سورە؟

*****************************************

ئەڵێن لەو مەتعەمەی كە كەریان سەر بڕییوو.
وەستای كەبابەكە ئەحۆل بوو.
بەدەم كەباب لێدانەوە ووتبووی: هۆش هۆش،چونكە گۆشتەكە بە شیشەكەوە نەدەوەستا.

*****************************************

ئەحۆل باسی ئازایەتی خۆی بۆ كچێك ئەكات و ئەڵێت بە یەك دەست ٢٠ سەیارە ڕائەگرم.
كچەكە ئەڵێت: بۆ تۆ ڕامبۆی؟
ئەحۆلیش ئەڵێت: نەوەڵا مرورم مروور.

*****************************************

مامۆستایەك لە خوێندكارەكانی ئەپرسێت كام مانگەی ساڵ لە هـەموو مانگەكان خۆشترە؟
ئەحۆل هەڵئەسێ و ئەڵێ: مامۆستا مانگی هەنگوینی.

*****************************************

سێ كەم ئەندام ڕوو ئەكەنە ماڵی ئەحۆل تا شەو لەوێ بمێننەوە.
دوای نان خواردن ئەحۆل ئەڵێ: جەماعەت ئەزانم هیلاكن،لەبەر ئەوە ئسسراحەتی خۆتان وەربگرن.
یەكیان دەست ئەبات بۆ قاچە سەناعییەكەی و لێی ئەكاتەوە.
دووەمیان دەستە سەناعییەكەی لێ ئەكاتەوە.
سێیەمیان دەست ئەبات سەری بخورێنێت.
ئەحۆل ئەڵێ:كاكە گیان بۆ خاتری خوا لێی نەكەیتەوە، وەڵاهی ماڵ و منالەكەم زیرە ئەكەن.

*****************************************

باوكی ئەحۆل ژنی بۆ ئەحۆل هێنا و پێی ووت كوڕم بتبینم،بزانم شەوی یەكەم چی ئەكەیت و سەرم بەرزبكەرەوە.
شەوی زاوایەتی یەت و ئەحۆل و بوكە خان لە ژورەوەن.
باوكی ئەحۆلیش لـە پشـت دەرگاكـەوە چـاوەڕوانی پەڕۆكەیـە و زۆر پەلەیەتی.

بوکە خان بە **ئەحۆل** ئەڵێ: وەرە با بۆیەی سوری نینۆکی لێبەین و خۆمان نەجاتبەین، کارەبا ئەبڕێت و لە جیاتی سور **ئەحۆل** بۆیەی سەوز لـە پەڕۆکە ئەدات، **ئەحۆل** پەڕۆکە ئەیاتە دەستی باوکی.

باوکی ئەڵێ: ئاااااا هەتیوو، واشمان نەوت، ئەوە خۆ زراوت تەقاندووە.

*******************************************

**ئەحۆل** و دوو برادەری دەچن بۆ ڕاو، برادەری یەکەمی کەروێشکێك ڕاو ئەکات،دووەهەمیان ئاسکێك ڕاو ئەکات.

**ئەحۆل** بەڕاکردن بەرەوڕوی دوو برادەرەکەی دێت و هاوار ئەکات.

ئـەو پڵنگـەی بەدوامەوەیـە بیگـرررررن، ئەچـم دانەیـەکی تـریش ئەهێنمممم.

*******************************************

کچێك توتییەك بە دیاری ئەبات بۆ **ئەحۆلـی** خۆشەویستی.

دوای ماوەیەك **ئەحۆل** تەلەفون بۆ کە پلەکەی ئەکات و ئەلێت: زۆر سوپاس بۆ توتییەکە،بەڵام وەڵاهی تامەکەی شتێکی وای جیاواز نەبوو لەگەڵ مریشکدا.

*******************************************

ئەحۆل لە ئەوروپا ئەگەڕێتەوە.
ژنەکەی پێی ئەڵێت: ها بزانم فێری زمانی ئینگلیزی بوویت؟
ئەحۆلیش ئەڵێ: جا چۆن فێربم؟ کە لە پاسێکدا ئەپژمیم، بیست کەس ئەیووت خێر ئەبێ ئیشەڵا.

*******************************************

چوار پیاو سواری تەکسی ئەبن و پارەیان پێ نییە.
سایەقی تەکسیەکەش ئەحۆلە، چوار پیاوەکە فێڵ ئەکەن، هەرکە ئەگەنە شوێنی مەبەس خێرا دائەبەزن و ڕائەکەن، هەر ڕائەکەن و ڕائەکەن، ئەگەنە باڵەخانەیەك و سەرئەکەونە سەرەوە، ئەچنە سەربانەکە و پشتیان ئەنوسێنن بە دیواری هەورەبانەکەوە، کەمێك بێدەنگ ئەبن و یەکێکیان بەوەی تەنیشتی ئەڵێ: وابزانم نەجاتمان بوو، بەڵام ئەرێ سایەقەکە چی بەسەر هات.
ئەحۆلیش ئەڵێ: وەڵا کاکە گیان من سایەقەکەم، بەس تو ئەو خوایە پێم بڵێن چی قەوماوە؟

*******************************************

ئەحۆل باوکی مردووە و زۆر ئەگری بۆی، لە پڕێکا تەلەفونێکی بۆیەت و دوای ئەوە بەخوڕتر ئەگری.
پێی ئەڵێن: بۆ خاتری خوا ئەحۆل چی تر قەوماوە؟

ئەحۆل بەدەم گریانەوە ئەڵێ: ئەوە خوشکەکەم بوو، ئەویش ئەڵێ باوکم مردووووە، باوکەڕۆۆۆۆۆ.

*******************************************

ئەحۆل و هاوڕێیەکی سەرخۆشن و پێکەوە هەر دەخۆنەوە.
لە پڕێکا هاوڕێکەی بە ئەحۆل ئەڵێت: ئەزانی لە کەر ئەچی؟
ئەحۆلیش ئەڵێ: هەتیوو بلێ ماشەڵا.

*******************************************

ئەحۆل بەسەرخۆشی ئەڕواتە ماڵەوە،دایك و خوشك و براکانی ئەیکەن بە بۆڵە بۆڵ و هەریەکە و بەجۆرێك پیایدا یەتە خوارەوە.
ئەحۆلیش زۆر لەسەرخۆ ئەڵێ: جگە لە باوکم،هیچ کەسێکی تر بۆی نیە گوی زیایە بخوات.

*******************************************

کاتی خۆی تازە مۆبایل و سیمکارت هاتبووە کوردستانەوە.
ئەحۆل بە باوکی ئەڵێ: باوکە ئەچم مۆبایل و سیمکارت ئەکرم.
باوکیشی ئەو شتانەی نەبیستووە،یەکسەر ئەڵێ: دانیشە کوڕم دانیشە،لەم ماڵە کونە سەگەیا جێگای خۆمان نابێتەوە،ئینجا وەرە نۆبەی مۆبایل و سیم تەڕەماشە.

*****************************************

هاوڕێیەکی ئەحۆل نوکتەیەکی زۆر خۆش بە نامەی موبایل بۆ ئـەحۆل ئەنێرێت.
ئەحۆل زۆری پێ خۆش ئەبێت تەلەفون بۆ هاوڕێکەی ئەکات و ئـەڵێت: وەڵای نوکتەیەکی زۆر خۆشە توخودا ئەگەر جارێکی تر بۆم نەنێریتەوە.

*****************************************

ئەحۆل بە خۆشەویستەکەی ئەڵێت: گیانەکەم هێندەی گەرمی هەناسەم تۆم خۆش دەوێت، تۆ لە زستاندا کلپەی ئاگری دڵی منی، بە هاوینان پەڵە بەفری ڕۆحمی، لە بەهاریشدا ناسکە هەوایەکی فێنکی منی.
کچەکە ئەڵێ: هەتیوو ئەوە تۆ باسی خۆشەویستی ئەکەیت یان کەش و هەوام بۆ ئەخوێنیتەوە.

*****************************************

ژنەکەی ئەحۆل لەبازاڕدا دزی لێ ئەکرێت، دوای ئەچێت شکات بکات.
پۆلیس لێی ئەپرسێت پارەکەت لەکوێدا دانابوو؟
ژنەکەش ئەڵێ: وەڵاهی تۆش وەك برام وای لەبەینی مەمکمدا.
پۆلیسەکە ئەڵێت: باشە چۆن ئەو دزە دەستی کرد بـە سـنگتدا و ئـەو پارەیەی دەرهێنا و هەستتت پێ نەکرد؟

ژنەکە ئەڵێت بەرەوەڵا هەستم کرد، بەس نەمزانی دزە.

*******************************************

ئەحۆل باخچەی ئاژەڵان ئەکاتەوە بلیتی چونە ژورەوە بە ٥ هەزار دینار ئەفرۆشێت کەس ناچێتە ژورەوە، ئەیکات بە ٣ هەزار، هەر کەس ناچێتە ژورەوە، لە داخا ئەیکات بەخۆڕای، سەیر ئەکات یەك و دوو بەرناکەوێت و پڕ ئەبێت لە خەڵك.
ئەحۆلیش لەداخا ئەچێت دەرگای قەفەزی شێرەکان ئەکاتەوە و بەرەڵایان ئەکات، پاشان ئەچێتە دەرگای سەرەکی باخچەکە و ئەڵێ: بلیتی چونەدەرەوە بە ١٥ هەزارە.

*******************************************

کوڕەکەی ئەحۆل فۆرمی دامەزراندنی پڕ ئەکردەوە.
بە ئەحۆلی باوکی ووت: ئالێرەدا چی بنوسم؟
ئەحۆل ووتی: کامە؟
کوڕەکەی ووتی: ئەوەی نوسراوە زمانی دایك؟
ئەحۆل ووتی: بنوسە زۆر درێژە.

*******************************************

ئەحۆل ڕۆژنامە دەفرۆشێت و هاوار ئەکات: قوربانییەکانی ئەمڕۆ گەشتە پە نجا کەس...قوربانییەکانی ئەمڕۆ گەشتە پە نجا کەس.
کابرایەك بە پەلە ئەڵێ: ئادەی ڕۆڵە ڕۆژ نامەیەکم بەرێ،دوای ئـەوە ئەحۆل هاوار دەکات: قوربانییەکانی ئـەمڕۆ گەشـتە پـە نجا و یـەك کەس..قوربانییەکانی ئەمڕۆ گەشتە پە نجا و یەك کەس.

*******************************************

ئەحۆل ژورێك لە میوا نخانەیەکدا ئەگرێت، لێی ئە پرسن ژورەکەت بە پشکەوە ئەوێت یا بێ پشکە.
ئەحۆلیش ئەڵێ: بابە بێ پشکە،بەیانی ئەحۆل یەتە خوارەوە و کچێکی زۆر جوان دەبینێت.
ئەحۆل دەڵێت: تۆ کێیت؟
کچەکە ئەڵێت: من پشکەم ئەی تۆ کێیت؟
ئەحۆلیش ئەڵێ: وەڵا من کەرێکم لەو گەورەی.

*******************************************

ئــەحۆل لـــە وەرگرتنـــی مۆڵـــەتی شـــۆفێری چـــووە قۆنـــاغی کردارییەوە،ئۆتۆمبیلی لێدەخوڕی کاکی مرور لەتەنیشتی دانیشت بـوو ووتی: کاکی خۆم بۆستە و بەگێك دابنێ.
ئەحۆل ووتی: بۆ دواوە یان پێشەوە.

****************************************

ئەحۆل ژنەکەی تەڵاقدا.
لێیان پرسی بۆ تەڵاقتدا؟
ئەحۆل ووتی: من حەزم لە هێلکە و ڕۆنە بەڵام ئەو کچە هەتیووە هەموو ڕۆژێك هێلکەی بۆ ئەکوڵاندم، بێ خوێ بــوو کــە ئــەم خــوارد زەختــی دائەبەزاندم.

****************************************

ئەحۆل لەفەیەك ئەخوات، تێری پێ ناخوات، لەفەیەکی تریش ئەخوات و تێر ئەبێ، لە دڵێی خۆیا ئەڵێ: شەڵا لەفەی یەکەمم نەخواردایە.

****************************************

بنکەی پــۆلیس هــەمووی دوو ســێ خولــەك دوورە لــە ماڵمانــەوە بــە سەیارە،دراوسێیەکمان دز هاتبووە سەریان،تەلەفونیان بۆ کردبوون، بە چارەکێ گەشت بوون و کە هاتن سەرپەرشتیارەکەیان ئەحۆل بوو.
خاوەن ماڵی داماو چووە بەردەمیان و ووتی: تازە دزەکە ڕایکرد، بەڵام خۆ دوو هەنگاو دورن لێمان بۆ ئەوەندەتان پێ چوو؟
مولازم ئەحۆل ووتی: وەڵا وتمان نزیکە،بۆیە بە پیاسە هاتین.

****************************************

باوکی ئەحۆل یەك زلەی لە ئەحۆل یا و ووتی: هەتیوووووو بۆ کاتژێر ٨ هەڵت نەساندم لەخەو؟
ئەحۆل ووتی: ئێ وەڵا هاتم خەبەرت بکەمەوە، بەڵام خەوتبوویت.

*******************************************

قازییەك لە تاوانبار ئەحۆلــی پرسی ناوت چییە؟
ئەحۆل ووتی: ئەحۆل
قازی: هاوسەرگیریت کردووە؟
ئەحۆل: بەڵێ لەگەڵ ئافرەتێکدا
قازی بە تورەییەوە ووتی: هەی گەمژە کەس هەیە هاوسەرگیری لەگەڵ پیاودا بکات؟
ئەحۆل: بەڵێ قوربان هەیە، من خوشکێکم هاوسەرگیری لەگەڵ پیاوێکدا کردووە.

*******************************************

ئەحۆل گیان دوو نانی گەرم بە قتویەك جێڵەوە ئەخوات.
دایکی ووتی: ئەیە رۆ ئەوە چیت کردووە ئەحۆل، جێڵی براکەتت هەمووی خواردووە.
ئەحۆل ووتی: وەڵا وامزانی مرەبایییە
دایکی ووتی: دەبچۆ بۆ نەخۆشخانە و خێرا مەعیدەت بەملا بشۆ.

*******************************************

ئەحۆل چوو بۆ دوکانێکی کۆمپیتەر تا لاپتۆپێك بکرێت
کابرای دوکاندار ووتی: مواسەفاتی چۆن چۆنی بێت؟
ئەحۆل ووتی: کاکە هەر فەیسبووك بکاتەوە عەیبی نییە.

*******************************************

ئەحۆل سواڵکەرە دەچێتە لای پاشا ئەڵێت: گەورەم ٢هەزارم بدەریٚ خێرت ئەگات.
پاشا ئەڵیٚ: نیمە.
ئەحۆل ئەڵیٚ: باشە هەزارم بدەریٚ.
پاشا ئەڵیٚ: نیمە.
ئەحۆل دەڵیٚ: ئیٚ باشە جلێکم بەریٚ جلم نییە لەبەری بکەم.
پاشا ئەڵیٚ: نیمە.
ئەحۆل تورە دەبێت و بە پاشا دەڵێت: ئیٚ باشە گەورەم بۆ نایەی شتێك بکەین؟
پاشا دەڵێت: چی بکەین؟
ئەحۆل دەڵێت: وەرە بەیەکەوە سواڵ دەکەین.

*******************************************

ئەحۆل ئەی ووت: من کوێرم.
لێیان پرسی چۆن بزانین ڕاستەکەیت و تۆ کوێریت؟
ئەحۆل ووتی: زۆر ئاسانە ئەو دارە ئەبینن؟
ووتیان: بەڵێ.
ئەحۆل ووتی: ئێ دەی من نایبینم.

*******************************************

ئـــەحۆل لەگــەڵ خۆشەویســـتەکەی ســـواری مـــاتۆڕ دەبن،لـــەڕێگا خۆشەویستەکەی دەڵێ: دڵت هی منە هەناسەت هی منە لێوت هی منە ئەحۆلیش دەڵێ: بڕۆ خوارێ تا نەتوتووە ماﻣۆڕەکەش هی منە.

*******************************************

بە درێژایی ئاهەنگێکی شەوانە و دوای سەیر کردنێکی زۆر لەنێوان ئەحۆل و کچێکا،کچەکە زۆر تامەزرۆ بوو بۆ ئەوەی ئەحۆل شتێکی پێ بڵێ.
ئەحۆل گیان چووە پێشەوە بۆلای و پێی ووت: سەما ئەکەیت؟
کچەش بەشەرمێکی زۆر و خۆشحاڵییەکی زۆرەوە ووتی: بەڵێ.
ئەحۆل ووتی: ئێ زۆر چاکە،کەواتە کورسیەکەتم پێویستە ئەییەم.

*******************************************

ئەحۆل بە ژنەکەی دەڵێت: ئافرەت ماچی لێوت چەند شیرینە.
ژنەکەشی دەڵێت: وەڵا ئەحۆل گیان خەڵکیش هەروام پێ دەڵێن.

*******************************************

بۆ یەکەم جار ئەحۆل و برادەرەکەی بڕیاریاندا تۆزێ سەعی بکەن بەیەکەوە، لەوکاتەدا کارەبا بڕا.
ئەحۆل چوو مۆمێکی هێنا و ژوورەکەی ڕووناك کردەوە.
برادەرەکەی ووتی: کاکە یەڵا بڕۆ پانکەکە دابگرسێنە جەوەکەی زۆر گەرمە.
ئەحۆلیش ووتی: هەی گێلە ئەگەر پانکە دابگرسێنم مۆمەکە دەکوژێتەوە.

*******************************************

بە ئەحۆلیان ووت: ئەوە خۆت خوشك و دایکت نییە، وا سەیری ناموسی خەڵك ئەکەیت؟
ئەحۆل ووتی: بەرەوەڵا هەمە، بەڵام ئەوەنە جوان نین.

*******************************************

دوکانی ئەحۆل ئاگر دەگرێت و هەموو شتەکانی ئەسووتێت.
لێی دەپرسن: خۆ زۆر زەرەرت نەکردووە؟
ئەحۆل ئەڵێ: نەوەڵا، لە خوا بەزیادبێت تەنزیلاتم کردبوو.

****************************************

**ئەحۆل** گیان ئەیەوێت پێڵاو بکرێت، پە نجا جووت تاقی ئەکاتەوە و هەر لچی لێ بائەیات.
کابرای دوکاندار پێی ئەڵێ: چییە کاکە گیان بۆ پێت نابن؟
**ئەحۆل**یش ئەڵێ: بەرەوەڵا، بەڵام بەدوای ڕەقەمێکی جوانا ئەگەڕێم.

****************************************

**ئەحۆل** لە قادرمەی ماڵەوەیان پێی دەخلیسکێت و دەکەوێتە خـوارەوە.
دکتۆر مەڵحەمێکی بۆ نوسی و ووتی: هەموو بەیانییەك بیە لە شـوێنی کەوتنەکەت.
**ئەحۆل**یش ئەچوو هەموو بەیانیەك ئەیدا لەو پلیکانەی لە قادرمەکە کە پێی خلیسکابوو لێی.

****************************************

**ئەحۆل** نەخۆشە بەڵام لەکاتی خۆیا دەرمانەکانی ناخوات.
پێی ئەڵێن: چۆنە وا بەقسەی پزیشك ناکەیت؟
**ئەحۆل**یش ووتی: من لە پزیشك ئاقڵترم، ئەمەوێت سەر لە میکرۆبەکان بشێوێنم.

******************************************

**ئەحۆل** ئەکەوێتە ناو مەفرەزەی مرورەوە.
مرورەکە پێی ئەڵێ: کوا پشتوێنی سەلامەتیت؟
**ئەحۆل**یش ئەڵێ: وەڵا کاکە شەروالم لە پیایە.

******************************************

بەرێوەبەری مۆزەخانە بە توڕەییەوە بە **ئەحۆل**ـی ووت: ئەو پەیکەرەی جەنابی نامبارەکت شکاندت تەمەنی ٥٠٠ ساڵ بوو.
**ئەحۆل**یش هەناسەیکی هەڵکێشا و بەزەردەخەنەیەکەوە ووتی: ئۆخەیش خۆ زیرەم کرد،وەمزانی تازەیە.

******************************************

قازییەك بە **ئەحۆل** ئەڵێ: سوێند بخۆ و بڵێ (بەخودا) یەکسەر **ئەحۆل** قسەکەی پێ ئەبرێت و ئەڵێ: ئای کە کۆنە، ئەی فێڵباز ئەتەوێت بڵێی: پشیلە گونت ئەخوات.

******************************************

**ئەحۆل** دوکانێك دائەنێت و یەکەم رۆژ سێ چوار بتڵی غازی تیادا ئەتەقێنێتەوە.

پێی ئەڵێن: کاکە گیان بۆ وائەکەیت،شێت بوویت؟
ئەحۆلیش ئەڵێ: چییە کاکە گیان،ئەوە دیعایەیە،دیعایە بۆ دوکانەکەم ئەکەم،غاز ئەفرۆشم غاز.

*****************************************

ئەحۆل داوای لە باوکی کرد ئایفۆنی بۆ بکڕێت.
باوکی ووتی: باشە بۆت ئەکڕم،بەڵام بە مەرجێ براکانیشت سەرخەیت.

*****************************************

لە پاسێکدا کچێکی زۆر جوان داوای ژمارەکەی ئەحۆل ئەکات.
ئەحۆل لە خۆشیا سیمکارتەکەی دەردەهێنێت و ئەیباتێ.

*****************************************

ئەحۆل و کە پلەکەی ئەبێت بە شەڕیان.
کە پلەکەی ژمارەکەی ئەگۆڕێت لە داخدا،ڕۆژێك بە ژمارە تازەکەی نامەیەك بۆ ئەحۆل ئەنێرێت و ئەڵێ: ئەوە لە ڕقی تۆ ژمارەکەم گۆڕی.
ئەحۆلیش ئەڵێ: وەڵاهی گەر لەبن زەویش بێت ژمارە تازەکەت هەر پەیدا ئەکەم.

*****************************************

ژنەکەی ئەحۆل ویستی یەکەم شەوی هاوسەرێتی دڵی ئەحۆل خۆش بکات.
پێی ووت: مژدەم بەرێ سکم هەیە.

*****************************************

ئەحۆل بە هاورێکەی ووت: ئەزانی لەم دنیایەدا متمانە نەماوە؟
برادەرەکەی ووتی: چۆن؟
ئەحۆل ووتی: بڕوا ئەکەی چووم لە گیرفانی باوکم پارە بـدزم کەچـی جزدانەکەم لە گیرفانیدا دۆزییەوە.

*****************************************

ئەحۆل زۆر تەمەڵ بوو لە وانەی زیندەوەرزانیدا، ڕۆژێکیان لەم وانەیەدا دەستی بەرزکردەوە، مامۆستا زۆر دڵی خۆش بوو ووتی: دیارە زیرەك بووە.
مامۆستاکەی ووتی: فەرموو ئەڵێی چی؟
ئەحۆل ووتی: مامۆستا لەشی مرۆڤ گۆشتە یا مریشك؟

*****************************************

ئەحۆل لە پۆلدا بوو هەر جاری ناجارێك پێدەکەنی، لەناکاو بەدەنگی بەرز پێکەنی.
مامۆستاکەی ووتی: ئەوە چییە شێت بووی؟

ئەحۆل ووتی: نەوەڵا مامۆستا نوکتەم بۆ خۆم ئەگێڕایەوە،کۆتا دانە زۆر بەهێز بوو یەکەم جارم بوو گوێم لێی بێت.

*******************************************

ئەحۆل لەسەر دزی گیرا بوو.
قازی: بۆ مۆبایلی ئەو کچەت دزیووە؟
ئەحۆل: من نەبووم،دەستە  پیسەکەم بوو.
قازی پێکەنی و ووتی: کەواتە حوکمی دەستت ئەیەم بە دووساڵ زیندانی کردن.
ئەحۆلیش دەستە  پلاستیکەکەی لێ کردەوە و لەسەر مێزەکە داینا و ووتی: بژی داد پەروەری.

*******************************************

ئەحۆل ئایفۆنێك ئەکڕێت و بۆ بەیانی ئەیبات بۆ کابرای خاوە دووکان و ئەڵێت: نامەوێت.
کابراش ئەڵێت: ئێ بۆ ناتەوێت؟
ئەحۆل ئەڵێ: وەڵا نامەوێت و نامەوێت.
کابراش ئەڵێ: ئێ بۆۆۆۆۆۆۆۆ ناتەوێت
ئەحۆل ئەڵێ: نامەوێت،چونکە سێوەکەی قە پێکی لێ گیراوە

*****************************************

بە ئەحۆل ئەڵێن: لەگەڵ ئەم هەموو فەرتەنەیەی ئێستای کوردستانا ئومێدت چییە؟
ئەحۆل ئەڵێ: وەڵا ئومێدەوارم هەر چوار پارچەی کوردستان بۆ ماوەی ڕۆژێك لە سەیرانگایەکا پێکەوەبن.

*****************************************

بە ئەحۆلیان ووت: زۆر شەرمەزارییە بۆت دوێنێ بیستمان ژنەکەت سێ چوار نەعلی تێگرتوویت.
ئەحۆل ووتی: بۆ شەرمەزارییە بەخوا تا ئێستا نەم هێشتووە هیچم بەرکەوێت.

*****************************************

ئەحۆل خەوی لێ ناکەوێت و ئەچێتە لای پزیشك.
پزیشك پێی ئەڵێ: کە پاڵ کەوتیت تا هەزار بژمێرە و خەوت لێ ئەکەوێت،هەر شەوی یەکەم ئەحۆل تا پێنج سەد ئەژمێرێت و خەریکە خەوی لێ بکەوێت،ئەچێت خێرا دەم و چاوی ئەشوات و دەست ئەکاتەوە بە ژمارە ژماردن.

*****************************************

ڕۆژێك بە ئەحۆل ئەڵێن: ئەوە بۆ چی ئـەمریکا و ئـەوروپا هـەر لـە پێشکەوتندان؟
ئەحۆڵیش ئەڵێت: لەبەر ئەوەی هەر هەموویان ئینگلیزی ئەزانن.

*****************************************

ئەحۆل تەلەفونێکی بـۆ یـەت لـە برادەرێکییـەوە و نایـەوێت وەڵـام بداتەوە، نامەیەك بۆ برادەرەکەی ئەنێرێت و ئەڵێت: ئەوە لەماڵەوە نیم و موبایلەکەم لە بیر چووە.
برادەرەکەشی ئەڵێت: باشە کە گەڕایتەوە تێلم بۆ بکە ئیشم پێتە.

*****************************************

بە ئەحۆل ئەڵێن: ژنەکەت چۆنە لە گەڵتا؟
ئەحۆل ئەڵێ: زۆر زۆر ڕێزم ئەگرێت، هەر کات ئەمەوێت قسەبکەم ئەڵێ: تۆ گوو مەخۆ.
هەرگیز نەیوتووە: تۆ گوو بخۆ.

*****************************************

ئەحۆل ڕێی ئەکەوێتە فلیپین،کاتێك ئەگەڕێتەوە لێی ئە پرسن فلیپین چۆن بوو؟
ئەحۆل ووتی: کورە ئەوان هەر زۆر دەوڵەمەنن
ئەڵێن: چۆن دەوڵەمەندن؟
ئەحۆل دەڵێت: کورە هەموو ماڵێك فلیپینییەکی هەیە.

*****************************************

ئەحۆل هەناری دەفرۆشت،مەحۆلێکی تری بەلادا تێپەڕی،وەڵا تڕێکی لێ بەر بووە،ئەحۆلیش هەنارێکی دا پێی.
مەحۆل ووتی: ئەگەر تڕێکی تر لێبەم هەنارێکی ترم دەدەیتێ؟
ئەحۆل ووتی: بەڵێ،وەڵا تڕێکی تریشی لێدا و هەنارێکی تریشی وەرگرت.
ئەم جارە مەحۆل هێزی دایە خۆی و بایەکی بە هێزی لێ بەر بووە تڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕڕ
ئەحۆل ووتی: هەموو هەنارەکان بۆ خۆت.

*****************************************

ئەحۆل گیان دەستگیرانەکەی لێی تورە بووە و زۆر بێتاقەتە
پێی ئەڵێن: باشە بۆ لێت تورە بووە؟
ئەحۆل ئەڵێ: وەڵا بڵێم چی،چووین بۆکافتریایەك و ویستم بڵێم با بچینە سەرەوە " چۆڵە "، لێم تێکچوو ووتم: بابچینە سەرەوە " حۆڵە "

وەڵا ئیتر تورە بوووو.

*******************************************

ئەحۆل پرسیار لە کۆمەڵەی ناسا دەکات و ئەڵێت: ئەوە بۆ ناچن بۆ سەر خۆر؟
کۆمەڵەی ناسا دەڵێن: چونکە زۆر گەرمە، هەر چییەك لێی نزیك بێتەوە ئەسووتێت.
ئەحۆل ئەڵێ: ئینجا بە شەو بچن.
پێی ئەڵێن: بە شەویش هەر گەرمە.
ئەحۆل ئەڵێت: ئینجا ئەتوانن بە زستاندا بچن، خۆ بە زستان رۆژ تینی گەرمی زۆر کەمە.

*******************************************

ئەحۆل چەند ساڵ بوو ژنی هێنا بوو، منداڵیان نەدەبوو، پاش هاتوو چۆی پزیشك و چارەسەری منداڵێکیان بوو.
ئەحۆل لە خۆشیا و بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکات، سێ رۆژ بە رۆژو بوو.
هەفتەیەك دواتر منداڵەکەیان دەمرێت.
ئەحۆلیش ووتی: شەرتبێت لە مانگی رەمەزانی کەم بکەمەوە.

*******************************************

ئەحۆل دەڵێت: بوومەلەرزەیەکی بـەهێز بـە گـوڕی ٨.٧ بەنگلادیشـی هەژاند،بەڵام کەس نەمرد.
ووتیان: چۆن؟
ئەحۆل ووتی: چونکە هەموویان لە کوردستانن.

*******************************************

ئەحۆل: کاکی پزیشك گیان کورە وەفریام کەوە، هەموو شەوێك دێوێکی سێ چاو دێتە خەووم وەختە دڵم بتۆقێت.
پزیشك: زۆر باشە بەڵام دەبێت سەد هەزارم بدەیتێ.
ئەحۆل: ئێ بەڕاست کاکی پزیشك گیان، دەی باشە لێی گەڕێ بۆ خـۆم لەگەڵ دێوەکە پێك دێم.

*******************************************

ئەحۆل گوێ بۆ سی دیەکی بەتاڵ ڕادەگرێ و دەست دەکات بەگریان
پێی دەڵێن: باشە بۆ دەگریت؟
ئەحۆل دەڵێت: ئاخر خەمی گۆرانی بێژەکەیمە،فەقیرە لاڵ بووە.

*******************************************

کەسێك دەکەوێتە چاڵێکەوە و یەك بەخۆی هـاوار دەکـات: یارمـەتیم بەن،لە ڕێگای خودا یارمەتیم بەن.

ئەحۆل بەوێدا تێدەپەڕێت و دەچێتە سەر چاڵەکە و ملی شۆڕ دەکاتەوە و دەڵێ: باشە کوڕی باش، ئاخر ئەوێ جێی سواڵ کردنە؟

*******************************************

ئەحۆل: ئەگەر جوان سەرنج بدەی چاوەکانم قسەت لەگەڵ دەکەن.
خۆشەویستەکەی: باشە بەڵام ئەوەندە چاو مەترووکێنە با دەنگت جوان بێ.

*******************************************

ئەحۆل ووتی: پار سی و سێ ڕۆژ بە ڕۆژو بووم.
ووتیان: بۆ خێرە؟
ووتی: ئێ نیو کیلۆ خورما مابوو بۆ بەربانگ خۆ فڕێی نایەم.

*******************************************

کچێك بە ئەحۆلــی ووت: حەزدەکەم ببین بە ژن و مێرد.
ئەحۆل ووتی: باشە بەڵام بەو مەرجەی من ببم بە مێردەکە.

*******************************************

ئەحۆل منداڵێك ئەفرێنێت و داوای ١٠٠ دەفتەر لە باوکی ئەکات.
باوکی ووتی: خواردنی ئەیەنیْ؟
ئەحۆل ووتی: بەڵێ بەڵێ.
باوکی منداڵەکە ووتی: ئەی باش ئەخەوێت؟
ئەحۆل ووتی: ئا ئا خەویشی باشە.
باوکی منداڵەکە ووتی: دە توخوا وەرن براکەشی بەرن.

*******************************************

ئەم ئەحۆڵەی لای خۆمان لەناو بازاڕدا لە خۆیەوە دەبورێتەوە ئەیفرێنن بۆ تەوارییەکە کە هۆشی دێتەوە.
پرسیاری لێ دەکەن و ئەڵێن: چی بوو، بۆ بورایتەوە؟
ئەحۆل دەڵێت: وەڵا بیرم چوو بوو هەناسە بدەم.

*******************************************

ئەحۆل دانیشت بوو باسی دوبەی بۆ حە پۆل دەکرد.
گووتی: بینای وای تێدایە ئەوەندە بەرزە ئەوەندە بەرزە، ئەگەر بکەویتە خوارێ بە سێ شەو بەسێ ڕۆژ ئینجا دەکەویتە سەر زەوی.
حە پۆل ووتی: یانی دەمری؟
ئەحۆل گووتی: ئەی گێلە ئەی سێ شەو سێ ڕۆژ بە ئاسمانەوە بێ نان و ئاو چۆن نامری.

*****************************************

لە ئەحۆلیان پرسی: خۆر گرنگە یان مانگ؟
ئەحۆل ووتی: بەدڵنیاییەوە مانگ،مانگ بەشەو یەت و دنیامان بۆ ڕووناک دەکاتەوە،بەڵام خۆر بەڕۆژدا دێت و ڕۆژ خۆی هەر ڕووناکە مەمنونی خۆر نەبووین.

*****************************************

ئەحۆل خانوو دروست ئەکات.
ئەچێ بنێشت بۆ کرێکارەکان ئەبات.
ئەڵێ: کەی بنێشتەکەتان تەواوکرد، خواردنتان بۆ ئەهێنم.

*****************************************

ئەحۆل بیری دەنکەکەی ئەکات، نامەیەکی کورتی ئەدەبیی بۆ ئەنێرێت و بۆی ئەنوسێت:
" گیانەکەم......تۆ تاکە حوشتری بیابانی دڵمی ".

*****************************************

ئەحۆل بەژنەکەی ئەڵێت: گوێ بگرە کچێ.
ژنەکەی ئەڵێت: فەرموو خۆشەویستم.
ئەحۆل ئەڵێت: تۆ ئەزانیت دایکت مانگایە.
ژنەکەی زۆر پێی سەیر ئەبێت و ئەڵێت: بۆ وا بە دایکم ئەڵێیت؟
ئەحۆل ئەڵێت: لەبەر ئەوەی پەنیرێکی وەك جەنابتی بووە.

*****************************************

منداڵەکەی ئەحۆل خۆیکرد بەژوردا و ووتی: باوکە تۆ و دایکم مریشك و کەڵەشێرن؟
ئەحۆل ووتی: ئەوە بۆ وادەڵێیت کچەکەم؟
کچەکەی ووتی: هەر جارێك دراوسێکەمان دەم ببینێت.
دەڵێت: جوجە گیان چۆنیت.

*****************************************

ئەحۆل ئەچێتە پرسەی هاورێیەکی خۆشەویستی دەست دەکات بەگریان و هاوار و بۆرە بۆر.
باوکی هاورێکەی بە ئەحۆل دەڵێت: کورم پێش مردنی جوانە مەرگە وەسیەتی کردووە کەس بۆی نەگری.
ئەحۆل دەڵێت: جوانە مەرگە جوانە مەرگە، جوانە مەرگە با گوو بخوات من زۆرم خۆش ئەویست چۆن بۆی ناگریم.

*****************************************

لە ئەحۆل ئەپرسن: ئەرێ ئەزانی کوڕی نوری مالیکی ناوی چییە؟
ئەحۆل ئەڵێت: بەڵێ،ناوی "قالە"یە.
ئەڵێن: چۆنت زانی؟
ئەحۆل ئەڵێ: هەموو جارێ لە جەزیرە ئەڵێ قالە نوری مالیکی.

*****************************************

ئەحۆل ماوەیەکی زۆرە خێزانەکەی نەبینیوە بۆیە ئەم نامەیەی بۆ ئەنێرێت:
" لە دوریت دەمەوێت بە دڵ بگریم، بەڵام وەڵاهی کە بیر لە دەم و چاوت ئەکەمەوە پێکەنینم یەت " .

*****************************************

ئەحۆل شەوێکیان هەژمارێکی فەیسبووک دادەنێت و ناوی نا:
" ئەگەر ئازای هاکم بکە ".
بەیانی هەڵسا سەیری کرد ناوەکەی گۆڕا بوو بۆ " دە فشە فش ".

*****************************************

ئەحۆل بە کچێك ئەڵێت: ناوت چییە ؟
کچەکە ئەڵێت: بێ تەربێت.
ئەحۆل ئەڵێت: ئەی ناوی باوکت چییە؟

*******************************************

ئەحۆل ئەڵێت: سەر لەم میلەتی کوردە دەرناکەم.
ماڵی بووك دەیانەوێت کچەکەیان بدەن بە کوڕێکی عاقڵ.
ماڵی زاواش دەیانەوێت ژن بۆ کوڕەکەیان بهێنن بۆ ئەوەی عاقڵ بێت.

*******************************************

مامۆستا: ئادەی ئەحۆل بزانم لە نێوان پارە و عەقڵدا کامیان هەڵ ئەبژێریت؟
ئەحۆل ووتی: مامۆستا پارە.
مامۆستاکە پێکەنی و ووتی: من عەقڵ هەڵئەبژێرم.
ئەحۆل پێکەنی و ووتی: وەڵا مامۆستا هەموومان ئەوە هەڵئەبژێرین کە نیمانە.

*******************************************

ماموٚستا: خوێندکار هەستە ناوی سیانیت بڵێ؟
قوتابی: توٚفیق ڕەفیق توفیق.
ئەحوٚل هەڵیدایە و ووتی: وەڵا ژمارەیەکی جوانە ئەوە نایفروٚشیت؟

*******************************************

ژنێکی چەنەباز بە ئەحوٚلــی مێردی دەڵێت: ناوی سێ حەیواناتی وەحشیم پێ بڵێ کە بە پیتی (خ) دەست پێ بکات؟
ئەحوٚلیش ئەڵێت: خوٚت-خوشکەکەت-خەسوم.

*******************************************

ئەحوٚل ژنەکەی نەخوٚشە و بەدیاریەوەیەتی.
ژنەکەی پێی ئەڵێ: ئەحوٚل ئەگەر بمرم توٚ چی ئەکەی؟
ئەحوٚل ئەڵێ: شێت ئەبم.
ژنەکەی ئەڵێ: ئەی ژن ناهێنیت.
ئەحوٚل: وەڵا نازانم، بەڵام شێت هەر چییەك بکات لێی ناگیرێت.

*******************************************

ئەحوٚل لە سەرەمەرگایە و لەسـەر جێگاکـەی کەوتووە،ژنەکەشـی لـە مەتبەخەکـەیا خـەریکی ناوسـاجی کردنە،بوٚنەکـەی یـەت بەسـەر ئەحوٚلدا،ئەحوٚل لە دڵی خوٚیا ئەڵێ هەر ئەبێ بوٚ کوٚتا جار تامی بکەم،

بە هەزار شەڕەشەق خۆی ئەگەیەنێتە مەتبەخ و ئەیەوێت ناوساجییەك هەڵبگرێ.
ژنەکەی پێی ئەڵێ: دەستی بۆ نەبەیت ها، بۆ ڕۆژی تەعزێکەتم داناوە.

****************************************

ئەحۆل لە سەربانێك ئەکەوێتە خوارەوە،لەگەڵ کەوتنی بە زەویدا خەڵك لێی کۆ ئەبنەوە و لێی ئە پرسن: ئەوە چی بوو برا؟
ئەحۆلیش ئەڵێت: وەڵا نازانم،منیش ئێستا هاتم.

****************************************

ماموستا بە ئەحۆل ئەڵێت چۆن ئەزانی گێزەر بۆ چاو باشە؟
ئەحۆل: چونکە تا ئێستا کەروێشکم نەدیتووە چاویلکەی لە چاودا بێت.

****************************************

ئەحۆل بە باوکی ووت: باوکە ئەمەوێت ئەو کچەی دراوسێمان بێنم.
باوکی ووتی: نا کوڕم ئەوە وەختی خۆی لەگەڵ دایکی ئەو کچە عیلاقەم هەبووە لەوە ئەچێت خوشکت بێت.
ئەحۆل ووتی: باشە ئەی ئەو کچەی بەرامبەرمان خۆ کچی چاکە.
باوکی ووتی: نا کوڕم بۆی هەیە ئەویش خوشکت بێت.

ئەحۆل زۆر بێزار بوو ڕۆیشت بە دایکی ووت: کە باوکم عیلاقەی هەبووە لەگەڵ هەموو ژنی گەڕەکەکەیان و ناهێڵێت ژن بێنێت.
دایکی ووتی: کوڕم بەدڵی خۆت کێ ئەهێنیت بیهێنە خۆ ئەمە باوکی ڕاستیت نییە.

*****************************************

ئەحۆل باسی ژیانی خۆی بۆ کە پڵەکەی دەکات ئەڵێ: باوکم شەش پێشانگای ئۆتۆمبیلی هەیە ٢٠ خانووی ٤٠٠ مەتری هەیە پارەی باشی هەیە.
ڕۆژی دواتر ئەحۆل ئەچێتەوە بۆلای کە پڵەکەی سەیردەکات شوی کردووە بەباوکی.

*****************************************

ئەحۆل لە چین کاری تەکسی ئەکرد.
هەرکەس دەستی لێبگرتایە ئەیووت: پێم ڕابوێرە ئێستا سوارم کردی.

*****************************************

ئەحۆل لەکاتی سەعی کردن بۆ تاقیکردنەوەی فیزیا ووتی: ئاخخخخ نیوتن ئاخخخخ خۆزگە لەجیاتی ئەو سێوە دارەکە بکەوتایە بەسەرتا و بمردیتایە.

*****************************************

ئەحۆل لەگەڵ ژنەکەی قسەدەکات دەڵێت: باشە حەیاتم، باشە هـەموو کەسم، باشە دڵەکەم، باشە ڕۆحەکەم.
لێی دەپرسن: ئەوە یەکەم جارمانە بتبینین تۆ ئاواها قسەبکەیت؟
ئەحۆل ئەڵێ: بێدەنگ بن ئەوە دوو هەفتەیە ناوەکەیم بیر چۆتەوە.

*****************************************

ئەحۆل خەو دەبینێت لە خەویدا یاری کۆمپیتەر دەکات و ژنەکەی خـۆی دەکوژێت.
کە خەبەری دەبێتەوە دەبینێت ژنەکەی لە پاڵیدایە.
دەڵێ: ئەی قوڕ بەسەرم بیرم چوو Save بکەم.

*****************************************

ئەحۆل دەچێت بۆ دووبەی و لە چێشتخانەیەك دەڵێت: الكباب.
کەبابی بۆ دێنن.
دەڵێت: البیاز.
پیازی بۆ دێنن.
دەڵێت: البرنج.
برنجی بۆ دێنن.

زۆر بە پۆزەوە دەڵێت پیاو تۆزێك عەرەبی بزانێت هەر باشە.
کابرای چێشت هێنەر دەڵێت: ئەگەر من کورد نەبوومایە الگوویشیان بۆ نەدەهێنایت.

*******************************************

ئەحۆل لە قەراغ ئاوێك دانیشت بوو.
کابرایەکی ئینگلیز لەولاوە ئەکەوێتە ناو ئاوەکەوە و مەلە نازانێت و هاوار ئەکات "Help"
ئەحۆلیش ئەڵێت: شەرت بێت دەرت نەکەم سەگباب، ئەوەنەی خۆت فێری ئینگلیزی کرد خۆت فێری مەلە بکردایە ئێستا نە ئەخنکایت.

*******************************************

ئەحۆل گیان ئەڵێت: پیاو عەیبە باسی خۆی بکات، بەڵام هەر جارێك ئەچم بۆ سۆپەرمارکێت، ڕێك دەرگاکەم بۆ ئەکەنەوە.
*******************************************

بە ئەحۆلیان ووت: باسی هاوڕێی کچمان بۆ بکە.
ئەحۆل ووتی: کچ وەك ئایفۆن وایە هەموو شتێکت بۆ ئەکات تا ڕۆژێك پێش ژن هێنانت، ڕۆژێك دوای ئەوە ئەبێت بە نۆکیای ٣٣١٠.

*******************************************

حه پۆل: من فەیسبووکم هەیە، یاهووم هەیە، ئێم ئێس ئێنم هەیە، گۆگڵ پڵەسم هەیە، سکایپم هەیە، تویتەرم هەیە.....فریای هەمووشی ئەکەوم.

ئەحۆل: چۆن ماوی، ژیانت هەیە؟

حه پۆل: ئۆو نەوەڵا ژیانم نییە، ئەتوانی بەستەرەکەیم بۆ بنێریت.

*****************************************

لە ئاهەنگێکدا، ئەحۆل ئەهێننە سەر شانۆ.

پێی ئەڵێن: ئەتوانی لاسای منالڵ بکەیتەوە بۆمان؟

ئەحۆلیش ئەڵێ: وەی بەسەرچاو، ئینجا ئەوە چییە؟ لێی ئاسانتر نییە.

میز ئەکات بە خۆیا و دەست ئەکات بەگریان.

*****************************************

ئەحۆل گیان چوو بۆ حەج، لەکاتی بەرد بارانکردنی شەیتانا، دەم و چاوی بە جامانەکەی هەڵپێچا بوو.

ووتیان: بۆ وا ئەکەیت؟

ئەحۆل ووتی: ئاخر ئەزانم رۆژێك هەر ئیشم تێی ئەکەوێت.

*****************************************

ئەحۆل بوو بە پزیشك، دەرمانی بۆ نەخۆشێك دانا و ووتــی: ڕۆژی دوو حەب. حەبێك یەك كاتژمێر پێش خەوتن، حەبی دووەم كاتژمێرێك پێش لە خەو هەڵسان بخۆ.

*******************************************

ئەحۆل و مەحۆل چوون بۆ وێستگەی شەمەندەفەر.
هەر ئەوان گەیشتن و شەمەندەفەرەكە ڕۆی، بەڕاكردن دوای كەوتن.
مەحۆل فریا كەوت و خۆی هەڵیایە ناوی.
ئەحۆلــی داماویش، پێی نەما و لێی دانیشت و لە پڕیایە قاقای پێكەنین.
لێیان پرسی: كاكە ئەوە بۆ پێ ئەكەنیت؟ خۆ براكەو بە جێی هێشتیت.
ئەحۆلیش ووتی: ئێ ئاخر منیش بەو كەرە پێئەكەنم،ئەوە هــات بــوو لەگەڵما بۆ خوا حافیزی.

*******************************************

ئەحۆل: ژنەكە خوا وەكیل لە هیندستان بوویتایە ئەیان پەرستیت.
ژن: بەڕاستە پیاوەكە، یەعنی ئەوەنە جوان و موهیمم؟
ئەحۆل: نەوەڵا ڕێك ئەڵێی مانگای.

*******************************************

جارێکیان کچێکی ناشیرین داوای خۆشەویستی لە ئەحۆل ئەکات.
ئەحۆل سەیر دەکات کچەکە زۆر ناشرینە و خۆی تورە ئەکات و ئـەڵێ:
عەیب ناکەیت داناوەشێیت، خۆت باوك و برات نییە.

*****************************************

ڕۆژێك ئەحۆل بۆ ڕاو ئەچێت بۆ ئەفریقا، دوای ئەوە یەتەوە برادەرێکی لێی ئە پرسێت: چیت ڕاو کرد؟
ئەحۆل: دوو فیل، چوار شێر لەگەڵ شەش نۆپلیس
برادەرەکە: نۆپلیس چییە ئەحۆل؟
ئەحۆل: نازانم حەیوانێك بوو، هەر میلم لێ دەهێنایەوە ئەیانووت نۆ پلیس.

*****************************************

ئەحۆل بەژنێکی دووگیانی ڕابواردبوو ووت بووی: ئەڵااااه ئەو ورگە جوانە چییە؟
ژنەکەش ووت بووی: ئەگەر بەدڵتە، مێردەکەم بانگ ئەکەم دانەیەکی وات بۆ دروست بکات.

*****************************************

پۆلیس ئەحۆل ئەگرێت و پێی ئەڵێت: لە کوێ ئەژیت؟
ئەحۆل ئەڵێت: لەگەڵ براکەم.
پۆلیس ئەڵێت: ئەی براکەت لە کوێ ئەژی؟
ئەحۆل ئەڵێ: لەگەڵ من.
پۆلیسەکە تورە ئەبێت و ئەڵێت: ئەی هەر دووکتان لە کوێ ئەژین؟
ئەحۆل دەڵێت: وەڵا لەگەڵ یەکدا.

*******************************************

ئەحۆل: سبەینێ یادی لەدایکبوونی کچێکی هاوڕێمە چ دیاریەکی بەمێ؟
مەحۆل: جوانە؟
ئەحۆل: ئەڵێی گوڵە.
مەحۆل: ژمارەکەی منی بەرێ.

*******************************************

ئەحۆل ئەچێت بۆ لای دکتۆر و ئەڵێ: بۆ خاتری خوا فریام بکەوە، لە بەیانییەوە ناتوانم پشتم ڕاست بکەمەوە...
دکتۆر دوای ئەوەی پشکنینێکی زۆری بۆ ئەکات و سەیرئەکا قۆپچەی کراسەکەی لە پانتۆڵەکەی بەستووە.

*******************************************

ئەحۆل لە پۆلی یەکە و بە باوکی ئەڵێ: بابە ئەوە بۆ هاوڕێکانم نازانن دارا دوو داری دی بخوێننەوە، کەچی من ئەیزانم؟
باوکی ئەڵێت: ئاخر کوڕم تۆ لە زیرەکییا چویتەتەوە سەر بابت.
پاشان ئەحۆل ئەڵێت: ئەی باشە بۆ من بە باڵا لە هەموویان درێژترم؟
باوکی ئەڵێ: ئاخر کوڕم ئەوە چوار ساڵە تۆ لە پۆلی یەکیت.

*****************************************

لە ئەحۆل دەپرسن: ئەوە بۆ پزیشکەکان کە یەکێك نەشتەرگەری دەکەن دەمامك دەبەستن؟
ئەحۆلـیش ئەڵێت: ئاخر بۆ ئەوەی ئەگەر نەخۆشەکە مرد، پزیشکەکە نەناسرێتەوە.

*****************************************

ئەحۆل بە پەلە ژنەکەی گەیاندە نەخۆشخانە و ووتـی: مەرگەمووشـی خواردووە.
دکتۆرەکە ووتی: ئەی بۆ هەموو گیانی شین و مۆر بۆتەوە؟
ئەحۆل ووتی: ئاخر خۆ بەقسەی خۆش نەیئەخوارد.

*****************************************

ئەحۆل دەچێت بۆ دزی، دەمانچە ئەخاتە سەر سەری خــاوەن ماڵەکـە و ئەڵێت بەس بجوڵێیتەوە بەشەق ئەتتۆپێنم.

*****************************************

ئەحۆل بەباوکی ئەڵێت باوکە مۆڵەتی شۆفێرییەکەم تەواو بوو.
باوکی دەڵێت: ئێ چۆن تەواو نابێت، تۆ شەو و ڕۆژ سەیارە لێ دەخوڕیت.

*****************************************

ئەحۆل بەبراکەی ئەڵێت: تۆ لەکوێ لەدایك بوویت؟
براکەی ئەڵێ: لەنەخۆشخانە.
ئەحۆل دەڵێ: بۆ نەخۆش بوویت.

*****************************************

ئەحۆل سەر و سمێڵی پاك سفر ئەکات و ئەچێتە ماڵەوە، بـە ژنەکـەی ئەڵێ: ئەوە چییە، وەڵاهی خەریك بوو نەتناسمەوە.

*****************************************

ئەحۆل مەرێك ئەكرێت و ئەیبات بۆ لای قەسابێك، پێی ئەڵێت: گۆشتەكەی و سەر و پێكەی و خورییەكەی و جەرگ و دڵ و ناوسكەكەی و هەر هەموویم ئەوێت.
کابراش ئەڵێ: ئەی سەوتەکەیت ناوێت بۆ جەرەسی موبایلەکەت.

*******************************************

ئەحۆل لای پینەچی پێڵاوەكانی دوورییەوە، دوای دوو هەفتەیەك ئەحۆل هاتەوە و بەكابرای پینەچی ووت: دەستت خۆشبێ چاك چاك بۆتەوە و هاتووم تەقەڵەكانیم بۆ دەربێنی.

*******************************************

ئەحۆل ئامۆژگاری خەڵكی دەكرد، ئەیووت: ئەگەر ویستتان بچن بۆ حەج و عەمرە، بچن بۆ سعودییە.

*******************************************

بە ئەحۆلـیان ووت: لە چین هەموو خولەكێك منالێك ئەبێت.
ئەحۆل ووتی: ئێ كاكە گیان ئەوان پێشكەوتوون، خۆ وەك لای خۆمان نییە نۆ مانگ تێپەڕێ و ئینجا منالێكیان ببێت.

*******************************************

لە ئەحۆلـیان پرسی: باوکت چەند ساڵە؟
ئەحۆل ووتی: وەڵا نازانم، بەس لەوەتەی بیرم یەت هەمانە.

*******************************************

لە ئەحۆل ئەپرسن: بۆ زۆپاکەت لە دەرەوە داگیرساندووە؟
ئەحۆل ووتی: ئاخر دەرێ لە ژورێ ساردترە.

*******************************************

بە ئەحۆل دەڵێن: ئەگەر بەیانی دەستت کرد بە گیرفانی کراسەکەتدا و دوو بیست و پێنجی تێدا بوو، چی ڕوو دەدات؟
ئەحۆلـیش ئەڵێ: یەکسەر باوکم هاوار ئەکات و ئەڵێ "حەیوان ئـەوە دیسان کراسەکەی منت لەبەرکردووە.

*******************************************

ئەحۆل و باوکی دەچن بۆ ماڵی خزمێکیان بە میوانی کە دەچنە ژوورەوە یەکسەرکارەبا دەبڕێت و دەست دەکەن بەماچ و موچی یەکتری،کارەبا لە پڕدێتەوە سەیردەکەن لەگەڵ یەك ماچ ماچێن دەکەن لە جیاتی لەگەڵ ماڵە خزمەکەیان.

******************************************

ئەحۆل و ژنەکەی دەبێت بە شەڕیان.
ژنەکەی تورە دەبێت و ئەڵێت: من ئەڕۆم و وازت لێئەهێنم.
ئەحۆلـــیش نازانێت چی بکات بۆ ئەوەی ژنەکەی نەڕوات لـــە ناچـــاریا ئەڵێت: من سکم لێت هەیە.

******************************************

لە ئەحۆل ئەپرسن: باشە ئەگەر مالیکی هێرشی کـــردە ســـەرمان چـــی ئەکەی؟
ئەحۆلـــیش ووتی: زۆر بێمنەتم لێی، هیچ ناترسم و تەلەفون ئەکەم بۆ ١٠٤

******************************************

ئەحۆل ژنێکی صینی دێنێت، دوای شەش مانگ ئەمرێ، لەبەرخۆیەوە ئەڵێ: ئەی لەو سەگبابانە، ئەوە خۆ ژنەکانیشیان عادین.

******************************************

ئەحۆل پارەیەکی زۆری تەزویر کردووە، هەرکە ئەچێت بۆ بازاڕ و خەرجی بکات، یەکسەر ئەیگرن.بە پۆلیسەکە ئەڵێ: باشە بەس پێم بڵێن چۆن زانیتان کە تەزویرە؟
پێی ئەڵێن: ئاخر ئەحۆل گیان، کوا پارەی ١٢٥٠٠ دیناری هەیە.

******************************************

ئامێرێکی ئەلیکترۆنی بەسترا لە ئەحۆل و پێیان ووت: ئەگەر درۆ بکەیت ئەو گلۆپە دائەگرسێت، تێگەیشتی؟
ئەحۆل ووتی: بەڵێ
یەکسەر گلۆپەکە داگیرسا.

******************************************

ئەحۆل خۆی ئەکاتەوە بە ماڵا و ئەڵێت: ژنەکە کۆمەڵێك تیرۆرست دایکتیان ڕفاندووە و ئەڵێن ١٠٠ دەفتەرمان ئەوێت یان بە بەنزین ئەیسوتێنین، مردم لە بەیانییەوە دەست لە خەڵك پان ئەکەمەوە.
ژنەکەی: ئێ، ئەی چەنت کۆکردۆتەوە؟
ئەحۆل: بەخوا نزیکەی ٥٠ لیتر بەنزین.

******************************************

مامۆستا لە ئەحۆل دەپرسێت: حوکمی مەنگۆلییەکان لە کوێ وە تا کوێ بوو؟
ئەحۆلــیش ئەڵێ: مامۆستا بەخوا دڵنیا نیم، بەس وابزانم لە لاپەڕە ٣٦ بۆ ٤١ کە.

*******************************************

مامۆستا لە ئەحۆلــی پرسی: چ گیاندارێك بەیانیان زوو لە خەو هەڵمان ئەسێنێ؟
ئەحۆل ووتی: مامۆستا باوکم.

*******************************************

ئەحۆل لوقمی شروبی ئەخوات،ئاردەکە بە لێوییەوە ئەمێنێتەوە و ئەڵێ: براڕۆ کە تازەیە، تۆزی شەریکەی پێوەیە.

*******************************************

ئەحۆل بۆیاخی بۆ ماڵێك ئەکرد، پێ یان ووت: بۆ جەریدەیەك، نایلۆنێك، شتێك ڕاناخەیت؟
ئەحۆل ووتی: قەینا دەستم ئەیگاتێ.

*******************************************

ئەحۆل نامەی نارد بۆ بەڕێوبەرەکەی ووتی: نەخۆشم و ناتوانم دەوام بکەم.
بەڕێوبەر وەڵامی دایەوە و ووتی: کاتێك نەخۆش دەکەوم ماچی ژنەکەم دەکەم باش دەبم، بڕۆ تاقی بکەرەوە.
پاش دوو کاتژمێر ئەحۆل نامەی ناردەوە بۆ بەڕێوبەرەکەی و ووتی: ئێستا زۆر باشم، ژنەکەت زۆر ڕۆح سووك بوو.

******************************************

ئەحۆل لەسەر دوکان بوو، پێیان ووت: گلۆپمان بەرێ.
ئەحۆلــیش بنێشتی پێدان، ووتیان: گلۆپ گلۆپ.
ئەحۆل ووتی: خۆتان بیجوون و گلۆپی پێ دروست بکەن.

******************************************

ڕۆژێك ئەحۆل بەسەر کەرەکەیەوە بەلای کچێکا ئەڕوات کچەکە گوڵێکی پێیە.
ئەحۆل ئەڵێ:ئەڵااااە ئەمە یەکەم جارە گوڵێك ببینم گوڵی بەدەستەوە بێت.
کچەکەش ئەڵێ:وااااییی،منیش ئەمە یەکەم جارە کەری دووقات ببینم.

******************************************

لە ئەحۆلـیان پرسی: بۆچی ئەمشەو هەواڵەکان دورو درێژبوو؟
ئەحۆل ووتی: لەوانەیە ئەڵقەی کۆتای بێت.

*******************************************

ماموستا لە ئەحۆلـی پرسی: ئەو شتە چیە کە پـەڕی هەیـە و کەچـی ناشفرێت؟
ئەحۆل ووتی: جا ئەوە چییە،سەرینی پەڕی کوردییە.

*******************************************

ئـەحۆل سـەیری تەلـەفزیۆن ئـەکا و ئـەبینێ دوو کـەس لـەناو تەلەفزیۆنەکەیا لەیەکتری ئەدەن، بە پەلە هەڵئەسێ و تەلەفزیۆنەکە ئەکوژێنێتەوە.
لێی ئە پرسن: ئەوە بۆ کوژانتەوە؟
ئەحۆلـیش ئەڵێ: کورە خۆ نەم کوژاندایەتەوە یەکتریان ئەکوشت.

*******************************************

ئەحۆل ژن ئەهێنێ و دوای سێ مانگ مناڵێکیان ئەبێت.
لێی ئە پرسن: باشە ئەمە چۆن؟
ئەحۆلـیش ئەڵێ: ئۆ هۆوووو، دەستمان کردەوە بە حەسودیەکە.

*****************************************

ئەحۆل دوای کچێك کەوتووە و لەبەر خۆیەوە ئەڵێ: بە قوربانی ئەو مەڕەبم کە ئەم بەرخە جوانەی بووە.
کچەکەش ئاورێکی لێ ئەیاتەوە و ئەڵێ: منیش بە قوربانی ئەو کەرەبم کە ئەم جاشولکە جوانەی بووە.

*****************************************

ئەحۆل : ژنەکە خوا وەکیل لە هیندستان بوویتایە ئەیان پەرستیت.
ژن: بەڕاستە پیاوەکە یانی ئەوەنە جوان و موهیمم؟
ئەحۆل : نەوەڵا ڕێك ئەڵێی مانگای.

*****************************************

لە ئەحۆل ئە پرسن: بۆچی منداڵەکانت شێوەیان لە تۆ ناچێت؟
ئەحۆل ئەڵێ: بۆ دراوسێی سەگ و سەگباب ئەهێڵن منداڵ لە خۆت بچێت.

*****************************************

ئەحۆل چوو بۆ شاییەك و سەرچۆپی گرتوو، پە نجەی کردووە بە ئەڵقەی ڕومانەیەکا و هەڵی ئەسورێنێت.
پێی ئەڵێن: کاکە گیان وریابە نەتەقێ.

ئەحۆڵــیش ئەڵێ: هیچ خەمتان نەبێ،تەقی تەقی، قلێكی تریشم پێیە.

*****************************************

ئەحۆڵ بوو بە سایەقی هەلیكۆپتەر، نەفەرەكان پێیان ووت: زۆر ساردە.
ئەحۆڵــیش پانكەكەی كوژاندەوە.

*****************************************

ئەحۆڵ: ژنەكە ملیۆنێك دۆلارم بۆ دەرچووە، خێرا خۆت كۆكەرەوە.
ژن: ئەڵا ئەحۆڵ بۆ كوێ ئەچین، جلی زستانە بێنم یا هاوینە؟
ئەحۆڵ: چی جل و بەرگت هەیە كۆیكەرەوە،نامەوێت چرۆچاوت ببیـنم ژنێكی جوانم هێناوە.

*****************************************

ئەحۆڵ چـوو بـۆ لای دكتـۆری دان، تــا دانــی هەڵكێشـێت، پــاش دان هەڵكێشانەكەی، ئەحۆڵ ١٠٠ دۆلاریدا بە دكتۆرەكە.
دكتۆر ووتی: باقیم پێ نییە.
ئەحۆڵ ووتی: جا ئەوە كەی كێشەیە، دانێكی تریشم بۆ هەڵكێشە.

*****************************************

ئەحۆل و هاوڕێیەکی بڕیار دەدەن بچن بۆ خۆپیشاندان، تەماشا دەکەن زۆر قەرەباڵغە و کەس بە کەسەوە نییە، ئەحۆل بە برادەرەکەی دەڵێت: عەلە، با بڕۆینەوە سبەینێ دێینەوە، ئەمڕۆ زۆر قەرەباڵغە.

****************************************

پیاوێکی زۆر قەڵەو ویستی بە ئەحۆل ڕابوێرێت بانگی ئەحۆلـی کردوو پێی ووت: ئەحۆلـە غەزەب ئەوە بۆ ئەوەندە زەعیف و لاوازیت، ئەگەر لەفەی گەز بویتایە دەبوایە بە داری تیر و کەوان بیان برژاندیتایە.
ئەحۆلـیش: بە کابرای ووت ئەگەر تۆش لەفەی گەز بوویتایە دەبوایە عەمووديان پیابکردیتایە و بیان برژاندیتایە.
****************************************

ئەحۆل دەست دەکات بە کێك خواردن و هەر وازناهێنێـت، خوشـکەکەی دەڵێت: برا خنجیلەکەم بەسە ئیتر ئەوەندە مـەخۆ چـونکە ئـەو کێکـە قومبەلەی تیایە کەمێکی تر دەتەقێتەوە.
ئەحۆلـیش دەڵێ: کەوا دەزانی خێرا لاچۆ با پارچەیەکت بەرنەکەوێت.

****************************************

مامۆستای بیرکاری بە ئەحۆل ئەڵێت: پێنج چاکەت و پێنج پانتۆڵ و چوار جووت پێڵاو ئەکاتە چەند؟
ئەحۆل دەڵێت: پێنج زەلام، بەڵام یەکێکیان پێی پەتییە.

## سەرچاوە

## کتێبی بەزمەکانی ئەحۆل (بەرگی چوارەم)

## کۆکردنەوەی :مامۆستا بەرژەوەند

